٢

# پێغەمبەری ئیسلام
# بایەخی بە سوننەتی خۆی نەداوە!

بابەتی دووەم کە زۆریان لەسەر نووسیوە، ئەوەیە کە دەڵێن: خودی ئەهلی سوننەت و جەماعەت و عامەی موسڵمانان، خۆیان دانیان بەو ڕاستییەدا ناوە، کە پێغەمبەری ئیسلام لە ژیانی خۆیدا بایەخی بەتۆمارکردن و پاراستنی سوننەتی خۆی نەداوە، تەنانەت سەرچاوەکانی فەرمووده ڕیوایەتی وایان گێڕاوەتەوە، کە داوای کردووە فەرمووده نەنووسرێتەوە. بۆ نموونە ڕیوایەتێك، کە دەڵێت:

(لا تَكْتُبُوا عَنِّي، وَمَنْ كَتَبَ عَنِّي غَيْرَ الْقُرْآنِ فَلْيَمْحُهُ، وَحَدِّثُوا عَنِّي وَلا حَرَجَ).[1]

واتە: لە منەوە هیچ مەنووسن، هەرکەس لە منەوە، جگە لە قورئان شتێکی نووسی، با بیکوژێنێتەوە. بەڵام (بە گێڕانەوە) بەبێ حەرەج لە من بگێڕنەوە.

ئەوان دەڵێن: لە کاتێکدا ئەم ڕیوایەتە بەلای خۆتانەوە دروستە، ئیتر بۆ نکوڵیی لەوە دەکەن، کە سوننەت لە سەردەمی پێغەمبەردا (صلی

---

(١) موسلیم لە بەشی (الزهد والرقائق)، بە ژمارە: ٥٣٢٦، گێڕاویەتەوە.

الله عليه وسلم) نەپارێزراوە و دەماودەم، تا دوو سەدە گێڕراوەتەوەو دواتر نووسراوەتەوە؟ ئەویش بە پشتبەستن بە زەین و بیرکردنەوە، بەبێ بوونی سەرچاوەی تۆمار کراو، کە ئەوە بۆ خۆی گومان لەسەر ڕیوایەت دروست دەکات، چونکە بەلای خودی زانایانەوە، جگە لە کەمێك لەجۆری (موتەواتەر) هەموو جۆرەکانی فەرموودەی دروست لە جۆری ڕیوایەتی (ئاحاد)، گومان دەگەیەنن، نەك یەقین و دڵنیایی.

لەم لایەنەوە یەکێك لە سەرکردەکانی ئەو ڕەوتە بەناوی (غولام ئەحمەد پەرویز)، دەڵێت: "ئەگەر سوننەت بەشێك بوایە لە دین، پێغەمبەر لە ڕووی نووسینەوەو لەبەرکردن و گێڕانەوەوە، مەنهەجێکی بۆ دائەنا، غەیری مەنهەجی قورئان، چونکە مەقامی دین ئەوە ئەخوازێت، کە بە پارێزراویی بیگەیەنێتە ئوممەتەکەی. ئەو بە هەرچی ڕێگە بوو هەوڵیدا، کە قورئان بپارێزرێت، بەڵام بۆ سوننەت هیچی نەکرد، بگرە قەدەغەی کرد، کە بنووسرێتەوە."(١)

وەڵامی ئەم بۆچوونە بەوە دەدەمەوە کە: مێژوونووسانی پێشین لەم بابەتەدا خەتایەکیان هەیە کە تەنها بە پشتبەستن بەو ڕیوایەتەی سەرەوە ئەو دەنگۆیەیان داخستووە، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) قەدەغەی کردووە، کە فەرموودەکانی بنووسرێنەوە، لەکاتێکدا بەم بەڵگانەی خوارەوە ئەو بۆچوونە بەو ڕەهاییە ڕاست و دروست نیە و، دەیان بەڵگە هەن لەسەر نووسینەوەی فەرموودە لەسەردەمی خودی پێغەمبەری خواو یارانیدا، لەوانە:

---

(١) کتێبی (مقام حديث) بە زمانی ئوردو، لا: ٧، بە نەقڵ لە: القرآنيون وشبهاتهم حول السنة، خادم حسين، ص: ٢٢٤.

١- عبد الله کوڕی عەمری کوڕی عاص دەڵێت: (هەرچیم ببیستایە لە پێغەمبەری خوا دەمنووسییەوە، دەمویست لەبەری بکەم. قوڕەیش قەدەغەیان کردم، وتیان: هەرچی لەپێغەمبەر دەبیستی، دەینووسییەوە، لە کاتێکدا پێغەمبەر مرۆڤە، لە کاتی تووڕەیی و کاتی ڕەزامەندیدا قسە دەکات؟ منیش دەستم لە نووسین کێشایەوە.

دواتر عەرزی پێغەمبەرم کرد، ئەویش بە پەنجەی خۆی ئاماژەی کرد بۆ دەمی و فەرمووی: بنووسە. سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە، جگە لە حەق و ڕاستیی، هیچ لەم زمانەم دەرنەچووە، یان دەرناچێت.)[1]

٢- ئەبو هورەیرە دەڵێت: (کەس لە یارانی پێغەمبەری خوا لە من زیاتر فەرموودەیان نەدەگێڕایەوە، جگە لەو حاڵەتەی عبد الله کوڕی عومەر، کە ئەو فەرموودەی دەنووسییەوە، من نەمدەنووسییەوە.)[2]

٣- پیاوێك لە پشتیوانان ئامادەی گوێگرتن لە فەرموودەکانی پێغەمبەر دەبوو، بەڵام بۆی لەبەرنەدەکرا.. پاشان سکاڵای حاڵی کەم حافیزیی خۆی کرد بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم). پێغەمبەریش پێی فەرموو: بۆ لەبەرکردنت پشت بە دەستت ببەستە (مەبەستی نووسین بوو).[3]

٤- کاتێکیش شاری مەککە لە ساڵی هەشتەمدا ئازاد کرا، پێغەمبەری خوا هەستاو لەناو خەڵکدا قسەی کرد، پیاوێك لە خەڵکی یەمەن

---

(١) ئەبو داوود لە ژمارە (٣٦٤٦) گێڕاویەتەوە.

(٢) بوخاری بە ژمارە (١١٣) گێڕاویەتەوە.

(٣) المقاصد الحسنة، ژمارە: ٩٩.

بەناوی (أبو شاه) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا! بۆ من بنووسنەوە. پێغەمبەریش فەرمووی: بۆ (أبو شاه) بنووسنەوە.[١]

٥- عبد الله کوڕی عەمری کوڕی عاص، دەڵێت: لە دەوری پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دانیشتبووین و دەماننوسییەوە.[٢]

٦- نامەو تۆمارە نووسراوەکانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە ژیانی خۆیدا، بەڵگەیەکی ترن، وەك: (دەستوری مەدینە)، کە کارنامەی پەیوەندیی نێوان موسڵمانان و دانیشتوانی هۆزەکانی جوولەکەی مەدینەی تێدا بوو. هەروەها: (پەیماننامەی حودەیبیە) و تۆماری تایبەتی پێغەمبەری خوا بۆ دانیشتوانی حەزرەمەوت و نووسراوی تایبەتی بۆ وڵاتی یەمەن، جگە لە نامە تایبەتەکانی بۆ پادشایان: موقەوقیسی فەرمانڕەوای میصر، نەجاشی پادشای حەبەشە، کیسرای پادشای فارس، هەرقلی گەورەی ڕۆم، مونزیری میری بەحرەین، پادشای عومان، حارسی حمیەری میری یەمەن، حارسی میری غەساسینە، هوزەی حەنەفی میری یەمامە. کە زۆرێك لەم نووسراوانە ئەحکامی شەرعییان تێدایەو سەرچاوەی تەشریعیی گونجاون.

٧- لە سەرچاوەکانی فەرموودەدا هاتووە، کە زۆرێك لە صەحابە ناسراوەکان تۆماری تایبەت بەخۆیان هەبووە، کە فەرموودەیان تێدا نووسراوەتەوە، پێیان وتووە: (صەحیفە)، بۆ نموونە: پێشەوا بوخاری باس

---

(١) بوخاری بە ژمارە (١١٢، ٢٤٣٤، ٦٨٨٠) و موسلیم بە ژمارە (٣٢٤٧) گێڕاویانەتەوە.

(٢) ئەحمەد بە ژمارە (٦٦٠٧) و دارەمی بە ژمارە (٤٨٦) گێڕاویانەتەوە.

لە صەحیفەی ئەبوبەکری صدیق ئەکات، کە مۆری پێغەمبەریشی لەسەر بوو، هەروەها صەحیفەی عەلی کوڕی ئەبو تالیب و عبد الله کوڕی عەمری کوڕی عاص و عبد الله کوڕی ئەبو ئەوفاو سەعدی کوڕی عوبادەو ئەبو موسای ئەشعەری و جابری کوڕی عبد الله و عەمری کوڕی حەزم،[1] خوالێیان ڕازی بێت. کە ئەوانەش چەندین ئەحکامی شەرعییان تێدا بوو.

٨ ـ بۆیە زانایان بۆ یەکخستنی مانای نێوان ئەو ڕیوایەتانە، کە هەندێکیان نووسینەوەی فەرمووده قەدەغە دەکەن و هەندێکیان مۆڵەت دەدەن، وتویانە: "ئەو ڕیوایەتەی کە باسی قەدەغەکردنی نووسینەوەی فەرموودەی تێدایە، (لا تکتبوا عنی.. هتد)، پەیوەندیی بە سەرەتای دابەزینی قورئانەوە هەیە، بۆ ئەوەی قورئانیان لەگەڵ فەرمووده لە لا تێکەڵ نەبێت. بۆیە کاتێك صەحابەکان ئاشنابوون بە جیاوازیی قورئان و فەرمووده، پێغەمبەری خوا مۆڵەتی دا کە فەرموودەکانی بنووسرێنەوە."[2]

---

(١) الإصابة في تمييز الصحابه، ابن حجر العسقلاني، القاهره، ٢٩٣/٤.

(٢) فتح الباري، شرح صحيح البخاري، ٢٨٠/١.

# بەشێك لە بۆچوونە نامۆکانی ڕەوتی قورئانییەکان

ئەم تاقمانە لەگەڵ ئەوەی هەندێکیان بۆچوونی دروست و جوانیان لەسەر چەند بابەتێك هەیە، بەڵام سەبارەت بە زۆرێك لە بابەتە فکرییەکان و ئەحکامە شەرعییەکان، قسەی جیاوازیان هەیە، هەندێك جار قسەی ناشایستەشیان هەیە، کە بەڵگەی نازانستیی بوون و جۆرێك لە هەرزەکاریی فکرییە، بۆ نمونە عبد الله جەکرالەوی - کە لای خۆی یەکێك لە دامەزرێنەران و تیئۆریستە گەورەکانیانە - دەربارەی هەوڵی تاقەتپڕوکێنی زانایانی فەرمووودەناس لە نووسینەوەی فەرموودەدا - کە هەندێك لە خۆرهەڵاتناسانیشی سەرسام کردووە - بەمجۆرە دەنووسێت: "پاش وەفاتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بە سەدان ساڵ، کەسانێك لە لایەن خۆیانەوە ئەم هەزەلیاتەیان تاشی، (مەبەستی نوسینەوەی فەرموودەیە) (!)، پاشان دایاننە پاڵ پێغەمبەری ئیسلام، کە ئەو بەرییە لەوانە."[1] ئەم قسەیە جگە لەوە

---

(١) دەقی قسەی عبد الله لە کتێبێکی خۆی بەناوی: (ترك احتمال تعامل)، لا: ١٢. بڕوانە: القرآنیون، خادم حسین، لا: ٢٥٠، کە دەقەکەی لێ نەقڵ کردووە.

کە هیچ مەرجێکی زانستیی تێدا نیە، بەڵگەیشە لەسەر ئەوەی، کە کەمترین شارەزایی لە ژیان و هەوڵی کەم وێنەی زانایانی فەرموودە نیە.

بەهەرحاڵ، لێرەدا بەشێوەی پێڕستیی ئاماژە بە هەندێك لە بۆچوونەکانی ئەو دەستەو تاقمانە دەکەم، پێم وایە زۆربەی ئەم بابەتانەی خوارەوە کە ئەوان ڕەدیان دەکەنەوە، پێویست بە وەڵامدانەوە ناکەن، چونکە زۆرێکیان - کە ئەوان قبوڵیان نین - لە ڕاستییە ئیسلامییە چەسپاوەکانن و بەڵگە نەویستن، وەڵامیشیان بوێت لێرەدا ناگونجێ بیاننوسین، چونکە هەرکامیان بەلای کەم، وتارێك، یان توێژینەوەیەکی پێویستە. بۆ نمونە:

- بڕوایان بە هیچ موعجیزەیەکی پێغەمبەران نیەو تەفسیری ماددی بۆ ئەو موعجیزانە دەکەن، کە قورئان باسی کردوون.

- هەندێکیان پێیان وایە، کە شایەتومان تەنها ڕستەی (لا إله إلا الله)یەو هێنانی ڕستەی (محمد رسول الله) لەگەڵ ناوی خوادا، چ لە بانگدا، چ لە تەحیاتی نوێژدا، چ لە هەرکات و جێیەکی تردا، جۆرێکە لە شیرك و هاوەڵدانان بۆ خوا !

- هەموو جۆرەکانی شەفاعەتی پێغەمبەری ئیسلام بۆ گوناهکارانی ئوممەتەکەی، ڕەد دەکەنەوە.

- بڕوایان بە موڵکدارێتی تاکەکەسیی نیە، لەسەر مەزهەبی کۆنە کۆمۆنیستەکانی سەرەتاو ناوەڕاستی سەدەی بیستەم.

- بڕوایان بەو جۆرە بەهەشت و دۆزەخە، نیە کە لە فەرمودەدا ڕوون کراونەتەوە، هەروەها سزاو پاداشتی ناوگۆڕو جیهانی بەرزەخیش ڕەد دەکەنەوە..

- بڕوایان بە شەیتان و جنۆکەو فریشتە نیە، بەوجۆرەی کە مەشهورە.

- بڕوایان وایە دوای قورئانی پیرۆز، سەرچاوەی دووەمی تەشریع دەسەڵات و فەرمانڕەوای سەردەمە، کە بەمەش دەڵێن (مرکز الملة)، نەك سەرچاوەکانی (سوننەت و ئیجماع و قیاس)و غەیری ئەمانە، لە سەرچاوە تەواوکارەکانی تری وەکو (عورف و ئیستیحسان و ئیستصحاب و مصالح مرسلەو... هتد).[1] دیارە ئەمە بیرو بڕوای بەشێك لەو دەستەو تاقمانەیە، نەك هەموویان..

**بە کورتی بنەما فکرییەکانیان بە گشتیی لە دوو خاڵدایە:**

**یەکەم:** هەموو ئەو بۆچوونە فکریی و حوکمە شەرعییانە ڕەددەکەنەوە، کە لە سوننەتدا ئاماژەیان پێکراوە.

**دووەم:** تەئویلی زۆرێك لەو ئایەتانە دەکەن، کە لە ڕێی فەرمودەوە ڕوون کراونەتەوە. واتە (تەبیین)ی پێغەمبەریان قبوڵ نیە، بۆیە لەم باسەدا زیاتر تیشکمان خستە سەر ئەو دوو خاڵە، کە پایەی سەرەکی بیرکردنەوەیانە.

هەر لێرەشەوە دەکرێ لە ڕادەی لادان و دوورکەوتنەوەی ئەو تاقمانە لە ڕاستەڕێی ئیسلام تێبگەین. هەروەها لە ڕادەی مەترسیی ئەو جۆرە بیرکردنەوەیەو ئەو شێوە تێگەیشتنە چەوتە لە ئیسلام، دڵنیا ببینەوەو دەرکی پێویستیی بەرەنگاربونەوەشیان بکەین.

---

(١) بۆ بینینی ئەم بۆچوونانە، بڕوانە: پێگە ئەلیکترۆنییەکانی قورئانییەکان، بەتایبەتی پێگەی (أهل القران) کە ئەحمەد صوبحی مەنصور سەرپەرشتیی دەکات، هەروەها کتێب: القرآنیون وشبهاتهم حول السنة، خادم حسین إلهي، ط٢، الطائف.

بەڵام ئەم کارە دەبێت بەشێوەیەکی زانستییانە ئەنجام بدرێت، دوور لە گشتاندن و دەمارگیریی و پەڕگیریی، دوور لە تێکەڵکردنی باسی ئەمانە لەگەڵ باسی ئەو زاناو بیرمەندە دڵسۆزانەی ئوممەتی ئیسلامیی، کە لە هەموو سەردەمێکدا هەبوون - بە سەردەمی خۆشمانەوە - کە کەم و زۆر ئەم باسانەیان وروژاندووەو دڵسۆزانە بۆ چارەسەر گەڕاون و بە بەشێك لە ڕەوتی ڕیفۆرم و چاکسازیی فکریی دەژمێردرێن، وەك لە سەرەتاوە ئاماژەمان پێکرد.

# حوجییەتی سوننەت لە قـورئـاندا

بابەتی حوجییەتی سوننەت و پێویستیی فەرمودە- و بەگشتیی سوننەت وەك سەرچاوەی دووەمی دەرهێنانی ئەحکام- بابەتێکە کە لە چەندین ئایەتی خودی قورئانی پیرۆزدا ئاماژەی بۆ کراوە. لە چەندین ئایەتدا لە پاڵ گوێڕایەڵیی خوای گەورەدا باس لە گوێڕایەڵیی پێغەمبەریش کراوە، یان باس لە ئەرکی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە ڕونکردنەوەی قورئاندا کراوە، کە ئەوە دەری دەخات جگە لە قورئان شتێکی تر دەبێ هەبێت کە بریتییە لە ڕونکردنەوکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم).

**لەم بڕگانەی خوارەوەدا ئاماژە بە بەشێك لەو ئایەتانە دەکەم:**

١- لە قورئاندا ئاماژەی ڕۆشن کراوە کە پاش ناردنی قورئان لەلایەن خوای گەورەوە، ئەرکێکی تایبەت لەسەر پێغەمبەرە، کە بریتیە لە ڕوونکردنەوەی قورئان. ئەوەتا دەفەرموێ:

﴿وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾﴾ النحل: ٤٤.

واتە: (ذکر)مان ناردووەتە خوارەوە بۆ لای تۆ، تا ئەوەی دابەزێنراوە بۆ خەڵکیی ڕوون بکەیتەوە. جا ئەگەر بڕیار بێت ڕوونکردنەوەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بۆ سەراسەری مرۆڤایەتی بێ، بە تان و پۆی زەمین و زەماندا، ئەوە دەبێ شتێك لەبەردەستی نەوەکانی دوای سەردەمی صەحابە هەبێ بە ناوی (ڕوونکردنەوەکانی پێغەمبەر) کە بریتین لە هەمان ئەو فەرمودە ڕاست و دروستانەی کە لە (صحاح)و (سنن)و (مسانید)دا پارێزراون. دیارە ئەمە مانای ئەوە نیە ئەو کتێبانە ڕیوایەتی لاوازو هەڵبەستراویان تێدا نیە، بەڵکو باس لەوەیە کە بەپێی ئەو ئایەتەو چەندین ئایەتی تر، دەبێت شتێك غەیری قورئان لەبەردەستی ئوممەتی ئیسلامیدا ببێت بەناوی (ڕونکردنەوەکانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)).!

لێرەدا پێویستە ئەوە ڕوون بکەمەوە کە ئەوانەی بانگەشە بۆ بیرۆکەی ئیکتیفا بە قورئان دەکەن و دەیانەوێت ڕۆڵی سوننەت کاڵ بکەنەوە، لەم ئایەتەو ئایەتەکانی تردا، تەئویلی وشەی (لِتُبَيِّنَ ) لە ئایەتەکەدا دەکەن و وا دەگەیەنن کە ئەرکی (تەبیین) کە خوا بە پێغەمبەری سپاردووە، هەمان ئەرکی گەیاندن (تبلیغ)ە، واتە خوێندنەوەو گەیاندنی قورئان بە خەڵکی، دیارە ئەمەش تەئویلێکی بێ بنەماو نازانستییەو نە وشەی (تبیین) دەیگەیەنێت، نە لەگەڵ پێگەو ئەرکی پێغەمبەرایەتیش یەك دەگرێتەوە.

٢- بۆ زیادە هەستکردن و چاك تێگەیشتن لە پێویستیی و کاریگەریی ڕوونکردنەوە، قورئانی پیرۆز ئەوە دەگەیەنێت کە ئەگەر پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ڕوونکردنەوەی پێویست نەدات لەسەر هەندێك لە ئایەتەکانی قورئان، ئەوە ڕاڤەو ماناکردنی لەلایەن موسڵمانانەوە جیاوازیی و چەند قسەیی تێدەکەوێت. ئەوەتا دەفەرموێ:

﴿ وَمَآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ إِلَّا لِتُبَيِّنَ لَهُمُ ٱلَّذِى ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ ۙ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٦٤﴾ ﴾ النحل: ٦٤.

٣- لە قورئانی پیرۆزدا چەندین ئایەت هەن کە گوێڕایەڵیی خوای گەورەو گوێڕایەڵیی پێغەمبەری خوایان، بەدوای یەکتردا هێناوە، وەك دەفەرموێ:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ وَلَا تُبْطِلُوٓا۟ أَعْمَـٰلَكُمْ ﴿٣٣﴾ ﴾ محمد:٣٣.

واتە: فەرمانبەردارو گوێڕایەڵی خوا بن و گوێڕایەڵیی پێغەمبەریش بکەن(صلی الله علیه وسلم) و کارو کردەوەکانتان پووچەڵ مەکەنەوە. جا ئەگەر گوێڕایەڵیی خوا بریتی بێت لە پەیڕەویکردن لە قورئانی پیرۆز، ئەی گوێڕایەڵیی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) دەبێت چی بێت جگە لە پەیڕەویکردن لە سوننەت و ژیاننامەکەی، کە فەرموودە دروستەکانی دەبنە بەشێك لەوە؟!..

ماوەتەوە ئەوە بزانین کە لەم بارەیەوە چەندین ئایەتی تر هەن، وەك:

﴿ قُلْ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ ۖ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٣٢﴾ ﴾
آل عمران: ٣٢

﴿ وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿١٣٢﴾ ﴾ آل عمران:١٣٢.

﴿ وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ وَٱحْذَرُوا۟ ﴾ المائدة: ٩٢.

﴿ وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١﴾ ﴾ الأنفال: ١.

٤- قورئانی پیرۆز لە هەندێك ئایەتدا بە ڕوونیی ڕۆڵی تەواوکاریی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە تەشریعدا دووپات دەکاتەوە، بۆ نمونە: قورئان لە زەمکردنی یەهودو بێ بڕواکانی ئەو سەردەمەی پێغەمبەردا فەرمویەتی:

﴿ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ ٱلْحَقِّ ﴾ التوبة: ٢٩.

یان پرۆسەی حەڵاڵ و حەرامکردن نیسبەت دەداتە لای پێغەمبەری خوا و دەفەرموێ:

﴿ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِىَّ ٱلْأُمِّىَّ ٱلَّذِى يَجِدُونَهُۥ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ وَٱلْإِنجِيلِ يَأْمُرُهُم بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَىٰهُمْ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ ٱلْخَبَٰٓئِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَٱلْأَغْلَٰلَ ٱلَّتِى كَانَتْ عَلَيْهِمْ ﴾ الأعراف: ١٥٧.

واتە: فەرمانیان پێ دەدات بە کارە پەسەندو چاکەکان، قەدەغەی کارە خراپ و ناپەسەندەکانیان لێ دەکات، هەروەها شتە خاوێن و پاکەکانیان

بۆ حەڵاڵ و ڕەوا دەکات، شتە پیس و بێ سوودەکانیشیان لێ حەڕام دەکات، ئەو کۆت و بەندانەش، کە پێشتر لەسەریان بووە، لەسەریان لا دەبات.[١]

ئەمە دەری دەخات، کە پێغەمبەری خواش بە تێگەیشتنی وردی خۆی لە قورئان، دەبێت حوکمی حەڵاڵ و حەڕامکردنی هەندێك شتی دابێت، کە دەبێت مرۆڤی موسڵمان پابەندیان بێت.

لێرەشدا دووبارە هەندێك بە هەڵە وتوویانە: مەبەست لەو ئایەتەو هاوشێوەکانی، ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا بابەتە حەڵاڵ و حەڕامە باسکراوەکانی قورئان بگەیەنێت، کە ئەمەش جارێکی تر خۆدزینەوەیە لەو ڕاستییە کە پێغەمبەری خوا لە سنورێکی دیاریکراودا دەسەڵاتی پێدراوە، وەگەرنا عەتف کردنەوەی وشەی (رسوله) بۆ سەر (الله) لە ئایەتی:

﴿وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ ٱلْحَقِّ﴾ التوبة: ٢٩.

هیچ تەئویلێك هەڵناگرێت، یان هێنانی وشەی (يحل لهم) (ويحرم عليهم)، چۆن ئەوە ناگەیەنێت، کە ئەو، هەندێك حوکم دەردەکات،

---

(١) یەکەم کەس لە زانایانی سەدەی دووی کۆچیی کە بە دوورو درێژی قسەی لەسەر ئەم بابەتە کردبێت، پێشەوا (شافعی)یە، کە لە کتێبی (الرسالة)یدا دەیان ئایەتی کردۆتە بەڵگە لەسەر حوجییەتی سوننە. کتێبی ناوبراو یەکەم کتێبی نوسراوە لە زانستی (أصول الفقه)و لەڕاستیشدا یەکێکە لە سەرچاوە زانستییە دێرینەکان، هەرچەند لەلایەن هەندێك موحەققیقی کۆن و هاوچەرخەوە ڕەخنە لە میتۆدو مەنهەجیەتی شافعی گیراوە، بەتایبەتی لە باسی دیاریکردنی سەرچاوەکانی تەشریعدا.

لە کاتێکدا بە کاراو (فاعل)ی کاری حەڵاڵ و حەرامکردنەکە ناو براوە؟!.

هەرگیز سیاقی قورئانیی و لۆژیکی عەقڵیی ڕێ نادات، کە بگوترێ: مەبەست لەمانە هەر خوێندنەوەو گەیاندنی خودی ئایەتەکانی قورئانە لەلایەن پێغەمبەرە، وەك گروپە قورئانییەکان دەیڵێن، ئەگەر وا بوایە: پێویست نەبوو باسی بکات، چونکە قورئانەکە بە پارێزراویی لەبەردەستی موسڵمانانندایە، چ پێویست دەکات قورئان خۆی ئاماژە بە دوپاتکردنەوەی حوجییەتی خۆی بکات.؟!.

## ڕاستکردنەوەی تێگەیشتنێکی هەڵە لە ئایەتەکانی

﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ﴿٣﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ ﴿٤﴾ ﴾

لە ئاقاری بەڵگەهێنانەوەدا لەسەر ئەوەی، کە هەرچی لە زاری پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) دەردەچێت (وەحی)و ئیلهامی خواییە، لەدێرزەمانەوە بە هەڵە بەڵگە بە ئایەتێکی سەرەتای سورەتی (النجم) دێننەوە کە دەفەرموێت:

﴿ وَٱلنَّجْمِ إِذَا هَوَىٰ ﴿١﴾ مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمْ وَمَا غَوَىٰ ﴿٢﴾ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ﴿٣﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ ﴿٤﴾ عَلَّمَهُۥ شَدِيدُ ٱلْقُوَىٰ ﴿٥﴾ ﴾ النجم: ١-٥.

گوایە ڕستەی (وما ينطق عن الهوى) ئاماژەیە بە هەر وشەو ڕستەیەك، کە لە پێغەمبەری خواوە دەردەچێت، لە کاتێکیدا سیاقی سورەتەکە - ناوەڕۆکی ئەو پێنج ئایەتە بەتایبەتی - دەیسەلمێنن، کە باسەکە باسی قورئانە، چونکە کاتێك ئەم سورەتە دابەزی، کە بتپەرستەکانی مەککە پێغەمبەریان تۆمەتبار کردبوو، کە ئەو قورئانەی دەیخوێنێتەوە و ڕێنەکردنەو خۆی هەڵی دەبەستێت، بۆیە بۆ بەدرۆخستنەوەی ئەوان ئەو

بڕگانە دابەزین، کە ئەمە واتاکانیانە: (سوێند بەئەستێرە لە کاتێکدا کە دەکشێت و بەردەبێتەوە. ئەم هاوەڵەتان (موحەممەد) نە گومڕا بووەو نە سەری لێ تێکچووە. لە هەواو ئارەزووی خۆیشەوە نایەتە گۆ. ئەوە (کە دەیخوێنێتەوە) وەحییەو بۆی وەحی دەکرێت. فریشتە خاوەن هێزە بە تواناکە (واتە: جبریل) بەباشیی فێری کردووە).

ئەمە تەفسیری گەورە موفەسسیرەکانی پێشینە، پێشەوا تەبەری (ت: ٣١٠ ك) - یەکەم موفەسسیری ناسراو لە سەرەتای سەدەی (٤)ی کۆچیدا - دەڵێت: "واتە: موحەممەد لە هەواو ئارەزوو ئەم قورئانە ناخوێنێتەوە، ئەم قورئانە وەحییەو بۆی دێت. (قەتادە)و زۆری تر بەم جۆرە تەفسیریان کردووە."[١] هەندێك لە موفەسسیرەکان وایانگەیاندووە مەبەست لەوەیە هەرچی لە زمانی پێغەمبەری خواوە دەردەچێت (وەحی)یە - لەوانە: (ابن کثیر) (٧٧٤ ك)و شەوکانی (ت: ١٢٥٠ ك)،[٢]- کە پێم وایە هەڵەکە لەوکاتەوە بڵاو بۆتەوە. لە کاتێکدا زۆربەی موفەسسیرانی تری پێش ئەوان، لەسەر بۆچوونەکەی پێشەوا (تەبەری) تەفسیریان کردووە کە مەبەست لە ڕاناوی (إن هو..) قورئانە، لەوانە: زەمەخشەری (ت: ٥٣٨ ك)، ڕازی (ت: ٦٠٦ ك)، قورتوبی (ت: ٦٧١ ك)، بەیزاوی (ت: ٦٨٥ ك)..هتد، کەدەکرێت سەیری تەفسیرەکانیان بکرێت.

---

(١) تفسیر جامع البیان، ابن جریر الطبري، ٢٥/٢٣.

(٢) بڕوانە تەفسیری ئایەتەکانی سەرەتای سورەتی(النجم) لە تەفسیری (ابن کثیر)دا.

وەڵامی ئەو تەفسیرەی دووەم ئەوەیە کە چەندین ئایەتی تر لەقورئانی پیرۆزدا هەن، کە خوای گەورە تیایاندا گلەیی و عیتابی پێغەمبەریان تێدا دەکات لەسەر هەندێك کارو بڕیاری خۆی، لەوانە:

- سورەتی (عبس وتولی)، لە بەسەرهاتی ئەو کەسە نابینایە (عبد الله کوڕی أم مکتوم)دا، کە هاتە خزمەتی و ئەو سەرگەرمی قسەکردن بوو لەگەڵ ژمارەیەك لە سەرانی قورەیش، بۆیە گوێی بەم نەدا. خوای گەورە لەسەر ئەو کارە لۆمەی کردو سورەتی (عبس) دابەزی.

- کاتێك لە (جەنگی بەدر)دا دیلەکانی هێشتەوە، خوای گەورە ئاگاداری کردەوە لەبەر ئەوە کە سەرەتای دامەزرانی دەوڵەتی مەدینە بوو، نەدەبوو لە شەڕەکەدا دیل بگرن. بۆیە ئەم ئایەتە دابەزی:

﴿ مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾ الأنفال: ٦٧.

واتە: هیچ پێغەمبەرێك بۆی نەبووە کە دیلی هەبێت، تا کاتێك لە سەرزەویدا جێگیرو دامەزراو ئەبێت.

- لە کاتی جەنگی (تەبوك)یشدا ژمارەیەك لە بەشداران کە زۆربەیان لە دووڕووەکان بوون، برو بیانوویان هێنایەوە بۆ خۆدزینەوە لە بەشداریی جەنگەکەو داوای مۆڵەتیان کرد، پێغەمبەریش مۆڵەتی دان، دواتر ئەم ئایەتەی سورەتی تەوبە لە عیتابی پێغەمبەردا دابەزی:

﴿عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ وَتَعْلَمَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٤٣﴾﴾ التوبة: ٤٣.

واتە: خوا لێت ببورێت ئەی موحەممەد! بۆ مۆڵەتت پێ دان؟ (دەبوایە مۆڵەتیان نەدەیتێ)، تا بۆت ڕوونببێتەوە کێ بوون ئەوانەی ڕاستیان کرد، درۆزنەکانیش بناسیت).

- کاتێکیش عبد الله کوڕی (أبي)، ڕابەری دووڕووەکان مرد، کوڕەکەی - کە کەسێکی موسڵمان بوو - هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا، داوای لێکرد کراسەکەی خۆی بداتێ، تا کفنی باوکی پێ بکات، هەروەها داوای لێکرد کە نوێژی لەسەر بکات و داوای لێخۆشبوونیش لە خوا بکات بۆی. بۆیە ئەم ئایەتە دابەزی:

﴿ وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ ۖ إِنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ فَٰسِقُونَ ﴿٨٤﴾ ﴾ التوبة: ٨٤.

واتە: ئەی موحەممەد، هەرگیز نوێژ لەسەر کەسێك (لە دووڕووەکان) مەکە کە دەمرێت، لەسەر گۆڕەکەشی ڕامەوەستە، ئەوانە بە ڕاستیی بەرامبەر خواو پێغەمبەری خوا بێبڕوا بوون (ڕاستییەکانیان زانی و پەردەپۆشیان کردن)، ئەوان بەلادەریی و فاسقیی مردن.

ئەم نمونانەی قورئانی پیرۆز، بەڕوونیی ئەوەمان پێدەڵێن: کە مەرج نیە هەرچی پێغەمبەری خوا فەرموویێتی یان کردبێتی، بەپێی وەحی خوایی بووبێت، بەڵکو هەندێك لە گوفتارو کردارەکانی بۆچوون و ڕاو ئیجتیهادی شەخصی خۆی بوون، بۆیە لەم حاڵەتانەدا کە لە سەرەوە ئاماژەمان پێکردن، لە لایەن خواوە یان عیتابی کراوە، یان ڕێی تری نیشان دراوە. ئەمەش باشترین وەڵامە بۆ ئەو بۆچوونەی کە پێی وایە مەبەست لە ﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ﴿٣﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ ﴿٤﴾ ﴾ هەموو قسەو گوفتارەکانی پێغەمبەرە، صلى الله عليه وسلم.

## جگە لە قورئان و سوننەت، گوێڕایەڵی (أولوا الأمر) یش هەیە

زیاد لەوەی کە (قورئانییەکان) دەیڵێن، کە قورئانمان بەسەو پێویستیمان بە فەرمودە نیە، ئایەت هەیە لە قورئاندا، کە دووپاتی دەکاتەوە دەبێ جگە لە قورئان و فەرمووده سەرچاوەیەکی تر هەبێ بۆ موسڵمانان، کە ببێتە مایەی گەشەی فیقهی ئیسلامیی و دامەزراوە تەشریعییەکان و نیشانەی زیندوویەتیی و واقعیەتی فیکرو فیقهی ئیسلامیی، ئەویش بریتییە لە ئیجتیهادو تێگەیشتنی ئەهلی ڕەئی و خاوەن فەرمان و موجتەهیدەکان لە سەردەمە جیاجیاکاندا، کە قورئان ناوی ناون (أولوا الأمر)، ئەمەش نهێنی مانەوەی ئیسلام و سازگاربوون و گونجانی شەریعەتەکەیەتی، لەگەڵ هەموو سەردەم و ژینگەو کۆمەڵگەکانی مرۆڤایەتی لە درێژایی مێژوودا، هەروەها هۆکاری قوتارکردنی شەریعەتی ئیسلامە لە چەقبەستوویی و داتەکاندنی تەپ و تۆزی کۆمەڵگەو ژینگە جیاجیاکان لەسەری و پێداچونەوەی ئەو ڕاو بۆچوون و ئیجتیهادو فتوایانەی، کە بەسەرچوون و پێویستان بە گۆڕین هەیە.

لەم بارەیەوە خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ ﴾ النساء:٥٩.

دیارە گوێڕایەڵیی خوای گەورە بە پەیڕەویکردنی قورئان دەبێ و گوێڕایەڵی پێغەمبەریش بە پێڕەویی ژیاننامەکەیەتی و گوێڕایەڵی خاوەن فەرمانانی موسڵمانانیش، بە پابەندییە بەو بۆچوون و ئیجتیهادو بڕیارانەوە کە لە سەردەمە جیاجیاکاندا بەپێی گۆڕانکارییەکان دەیدەن، لە ژینگەو شوێن و هەل و مەرجە جیاجیاکاندا، کە تا ئێستا بریتیە لەو ئیجتیهادو بۆچوون و فتوایانەی لە سەدە ڕابردووەکاندا گەڵاڵە بوون و مەنزومەی (فیقهی ئیسلامی)یان پێك هێناوە.

لێرەدا زۆر پێویستە ئەوە بزانین کە دەکرێ - بگرە دەبێ - ئەو ئیجتیهادو بۆچوون و فتوایانە، بگۆڕێن و تەنانەت هەندێ جار پێچەوانەیش ببنەوە، چونکە بۆ سەردەمی خۆیان حوججەت و بەڵگە بوون و مەرج نیە بۆ هەموو کات و شوێنەکان حوجبییەتیان بمێنێ.

لەم خاڵەدا پێویستە ئەوەش بزانین کە چەمکی (أولوا الأمر) زۆر فراوانترە لەوەی، کە لە سەردەمە پێشووەکاندا تەسك کرابووەوە تەنها لە کاربەدەستان یان چەند فەقیهێکدا، کە ڕەنگە بۆ ئەو سەردەمانە، تاڕادەیەك گونجاو بووبێت، بەڵام ئەگەر بە تێگەیشتنێکی قورئانییانەو هاوچەرخانە لەو چەمکە ورد ببینەوە، تێدەگەین، کە (أولوا الأمر) بۆ ئەم سەردەمە، دەبنە ئەو کەسە پسپۆڕو لێزانانەی، کە لە ڕووی شارەزاییەوە توانای یەکلاکردنەوەو بڕیاریاردانیان لەسەر پرسە جۆراوجۆرەکان هەیە، لە سیاسەت و ئیدارەو دەسەڵاتدارییەوە، تا

دەگاتە بوارەکانی دارایی و ئابووری و کۆمەڵایەتیی و زانستیی و هتد. دیارە ئەمانەش لە سەردەمی ئەمڕۆ و دەوڵەتی مۆدێرندا، خۆیان لە دامەزراوەی دەستوریی و یاسایی شەرعیدا دەبیننەوە.

**کتاب و حیکمەت پێکەوەن:**

خاڵێکی تری گرنگ ئەوەیە، کە ئایا مەبەست لە (حیکمەت) لە قورئانی پیرۆزدا چیە، کە لە چەندین ئایەتدا لە پاڵ (کتاب)دا ئەرکی فێرکردنی سپێرراوە بە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)؟ بۆنمونە: خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿ كَمَآ أَرۡسَلۡنَا فِيكُمۡ رَسُولٗا مِّنكُمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِنَا وَيُزَكِّيكُمۡ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمۡ تَكُونُواْ تَعۡلَمُونَ ﴿١٥١﴾ ﴾

البقرة: ١٥١.

لێرەدا کاتێك باسی خوێندنەوەی وردو بەردەوامی ئایەتەکان کراوە، ئەی مەبەست لە فێرکردنی (حکمة) لە پاڵ (کتاب)دا چیە، ئەگەر شتێکی جیاواز نیە لە قورئان، کە هەمان ژیاننامەو سوننەتی پێغەمبەر خۆیەتی (صلی الله علیه وسلم)، لەگەڵ ئەو شتانەی، کە لەگەڵ ڕاستییەکانی قورئان و سوننەتی صەحیحدا یەك دەگرنەوە؟ ئەم دەستەواژەی (کتاب)و (حکمة)یە لە پاڵ یەکتردا لە چەندین شوێنی تری قورئاندا دووپات کراوەتەوە، وەك: (آل عمران:٦٤)، (الجمعة:٢)، (البقرة:١)، (النساء: ١١٣)، (الأحزاب:٣٤).

لەم بەشەدا، لە چەند خاڵێکدا گرنگترین بابەتەکانی مامەڵە لەگەڵ (سوننەت)دا ڕوون دەکەمەوە، بەتایبەتی لە ڕووی چۆنیەتی کارکردن بە سوننەت و ڕوونکردنەوەی ئەوەی، کە چ جۆرێکی (سوننەت) بە بەڵگەی شەرعیی وەردەگیرێت، کە ئەوەش پێویست دەگێڕێت لە جۆرەکانی مامەڵەو هەڵسوکەوتی پێغەمبەر (تصرفات النبي) و پێگەی فەرموودەو سوننەت بەگشتیی و جۆرەکانی سوننەت لە ڕووی حوجییەتەوە، تێبگەین، بەو پێیەی ئەسڵی بابەتەکەی، کە ئەم کتێبەمان بۆ تەرخان کردووە، پەیوەندیدارە بەم باسانەوە:

# جۆرەکانی سوننەت
# لە ڕووی حوجییەتەوە

سوننەت بە هەموو بەشەکانییەوە: (فەرمووده)و (کردار)و (ئیقرارەکان)ی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، لە ڕووی بە بەڵگەبوون و حوجییەتەوە، دەبنە سێ جۆری سەرەکییەوە:

١- بەشێکی ئەو گوفتارو کردارو ئیقرارانە، پێغەمبەری خوا وەك پێغەمبەرو نێرراوی خوا بە نیازی (تەبلیغ)و ڕوونکردنەوەی ئەحکام و لە زیمنی پرۆژەی تەشریعدا، فەرمووني، یان کردووني..

ئەمجۆرەیان بە ڕەچاوکردنی ڕێساکانی (إطلاق و تقييد)، (عام و خاص)، (إجمال و تفصيل). دەبنە حوججەت و حوکمیان لێ وەردەگیرێت و پەیڕەوی لێکردنیان واجیبە. هەرکاتێکیش لەم باسەدا بە ڕەهایی باسی حوجییەتی سوننەتمان کرد، ئەم بەشەیمان مەبەستە، کە دەبێتە سەرچاوەی دووەمی تەشریع و وەرگرتنی ئەحکام، نەك بەش و جۆرەکانی تر.

دیارە هەندێك ئاماژەو بەڵگە هەن، کە دڵنیامان دەکەنەوە ئەو بەشە لە سوننەت کامەیە، کە دەبێتە حوججەت و پەیڕەوی لێکردنی پێویستە،

کە لێرەدا ئاماژە بە گرنگترین ئەو ئاماژەو بەڵگانە دەکەم:

- هەندێك جار خودی پێغەمبەری خوا، خۆی ئاماژە دەکات، کە (جبریل)ی فریشتەی ڕاسپێردراوی وەحی پێی ڕاگەیاندووم.

- هەندێك جار خودی پێغەمبەری خوا ئاماژە دەکات، کە خواو پێغەمبەری خوا فلان شتیان حەرام کردووە، یان حەلاڵیان کردووە.

- یان هەندێك دەستەواژە بەکاردەهێنێت، وەك: (إن الله أوجب)، یان (فرض)، یان (أمر)، یان ) أحل) یان (حرم)..).

٢- ئەو قسەو گوفتارانەی دەکەونە خانەی (تصرفات)ی شەخصی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، کە بە ئیعتیباری مرۆڤێکی ئاسایی و غەیرە موشەرریع، وەك محەممەدی کوڕی عبد الله، بە حوکمی عورف و عادەت و نەریتی سەردەمەکەی، یان بەحوکمی جبیللەتی شەخصی و سروشتی مرۆڤبوونی خۆی، فەرموونی، یان ئەنجامی داون، وەك جۆری خواردن و خواردنەوەو حەزەکانی ئەو بوارەو جۆری پۆشین و ڕۆیشتن و دانیشتن و هتد.

ئەم جۆرە لە سوننەت بەلای زانایانی موحەققیقەوە - وەك جصاص، قازی عیاض، قرافی، عز بن عبد السلام، شاطبي و دینەوەری- ناچنە بازنەی حوججەی شەرعی و کارپێکردنیان حوکمی ڕەوایەتییی (إباحة)ی هەیە، نەك واجببوون. بۆیە زانایەکی وەك (أبو بكر الجصاص (ت: ٣٧٠) لە سەدەی چواری کۆچییەوە لە پێناسی (سوننەت)دا وتوویەتی: "سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەوەیە، کە کردوویەتی،

یان وتوویەتی، تا چاوی لێ بکرێ و لەسەری بەردەوامیی هەبێت."[1]
ئیبن قوتەیبەی دینەوەریش وتوویەتی: "سوننەت لەئایندا دەبێت، نەك لە خواردن و خواردنەوەدا.. بۆ نمونە: ئەگەر کەسێك کولەکەی نەخوارد - لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا زۆر حەزی لێی بوو - ناگوترێت ئەو کەسە سوننەتی واز لێ هێناوە."[2]

ئەم جیاکردنەوەیە، خودی پێغەمبەری خوا لە ژیانیدا ئەنجامی داوە، لە ڕیوایەتێکدا هاتووە: (کاتێك گەیشتە شاری مەدینە، بینی کە دانیشتوانی ئەو شارە خورمای نێرو مێ لە یەکتر متوربە دەکەن، فەرمووی: ئەگەر ئەوەش نەکەن لەوانەیە خێر بێت. ئەوانیش دەستیان هەڵگرت، ئەو ساڵە بەشێکی ئەو باخە خورمای نەگرت، بەشێکیشی بەرەکەی پووچ دەرچوو. باسەکەیان بۆ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی:

(إنما أنا بشر، إذا أمرتكم بشيء من دينكم، فخذوا به، وإذا أمرتكم بشيء من رأيي، فإنما أنا بشر).[3]

واتە: ئەڵبەتە من مرۆڤم، هەرکات لە بابەتێکی ئاینەکەتاندا فەرمانم بە هەر شتێك پێتان کرد، وەریبگرن. ئەگەر بەڕای خۆیشم فەرمانێکم بەسەرتانا دا، ئەوە بزانن، کە من مرۆڤێکم).

---

(١) الفصول فی الأصول، أبو بكر الجصاص، ٣/٢٣٥.
٩٢) تأویل مصطاح الحديث، ابن قتيبه الدينورى، ص: ٤٨.
(٣) موسليم بە ژمارە (٤٣٦٤) گێڕاویەتەوە.

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێ:

(.. إنما أنا بشر، أرضى كما يرضى البشر، وأغضب كما يغضب البشر..)[١].

واتە: بە دڵنیایی من مرۆڤێکم، وەك مرۆڤ ڕازی ئەبم، وەك مرۆڤیش تووڕە دەبم.

٣- ئەو بەشە لە گوفتارو کردار، کە لە پێغەمبەری خواوە وەك موفتی و قازی سەردەمی خۆی لێی دەرچووە، کە مەرج نیە حاڵەتەکان کت و مت پێکابێتی، چونکە هەندێکیان دوور لە (وەحی) ئەنجامی داون، بۆیە هەندێکجار لەسەر هەندێك لەمانە لەلایەن خوای گەورەوە لۆمە کراوە. ئەوانەشیان، کە حوکمدانن، یان قەزاوەتن، مەرج نیە لەگەڵ ئەم سەردەمە یەکبگرنەوە. ئەو تەقدیرەش بەلای زانایانەوە جێ هێڵراوە بۆ خەملاندن و دیاریکردنی قازی و موفتی هەر سەردەمێك.

زانای ناسراوی کورد (ابن تيمية) - هەرچەند زۆر لەگەڵ ئەم پۆلێنکردنەشدا نیە - دەڵێت: "بەڵگە لەسەر ئەوەی، کە سوننەت و فەرمانەکانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەندێکیان بەبێ وەحی بوون و بە ڕەئی و هەڵبژاردنی خۆی بوون، ئەوەیە کە لەلایەن خواوە لۆمەی لەسەر کراوە، لە کاتێکدا ئەگەر (لە لایەن خواوە) فەرمانی بەسەردا بدرایە، لۆمە نەدەکرا لەسەری، لەوانە: حوکمی پێغەمبەر لە دیلەکانی بەدردا، یان وەرگرتنی فیدیە لە دیلان، یان مۆڵەتدانی بەوانەی لە جەنگی (تەبوك)دا بیانوویان هێنایەوەو

---

(١) موسلیم بە ژمارە (٢٦٠٣) گێڕاویەتەوە.

خۆیان دواخست. یان فەرمانی (وشاورهم فی الأمر) کە پێی درا، کە ئەگەر وەحی بەردەوامی لەگەڵ بوایە، پێویستی بە ڕاوێژ نەدەبوو."(١)

زانا گەورەکان بە باشی لەم بابەتە تێگەیشتوون، بۆیە پێشەوایەکی وەکو (نەوەوی) کاتێك کە پۆلێنی ئەم فەرموودانە دەکات، ئەم ناونیشانەی داناوە:

(وجوب امتثال ما قاله (صلى الله عليه وسلم) شرعا، دون ما ذكره من معايش الدنيا على سبيل الرأي).

واتە: پێویستیی گوێڕایەڵیی ئەوەی کە پێغەمبەر وەك شەرع وتوویەتی، نەك ئەوەی لەسەر کاروباری بژێویی و ژیانی دونیا وتوویەتی، بەشێوازی بۆچوون و ڕەئی.(٢)

---

(١) المسودة في أصول الفقه، ابن تيمية، ٤٥٢/١.

(٢) بڕوانە: شەرحی نەوەوی لەسەر صەحیحی موسلیم، (كتاب السلام)، باب وجوب امتثال ما قاله (صلى الله عليه وسلم) شرعا، دون ما ذكره من معايش الدنيا على سبيل الرأي).

# تێگەیشتن لە پێگەی فەرموودە و سوننەت بەگشتیی

ئەم بابەتە لە دێرزەمانەوە مشت و مڕی زۆری لەسەرە، ئەوەشە وایکردووە کە ڕەوتی جۆراوجۆر دورست ببێ، کە بەندە لێرەدا لە سێ تەوژم و ڕەوتدا کورتیان دەکەمەوە:

١- ڕەوتێك کە ئەو دەستەیەن لەم نامیلکەیەدا ئاماژەمان پێکردن، بە تەواوی سوننەت ڕەدەکەنەوە و بە سەرچاوەی دووەمی شەریعەتی نازانن، تەنانەت ئەو بەشی یەکەمەش کە لە بڕگەی (١)دا پێناسمان کرد.

٢- ڕەوتێك کە لە دژایەتی ئەوانەدا زیادەڕەویی دەکەن و لە گێڕانەوەو وەرگرتنی فەرموودەو سوننەتدا دەست شلدەکەن و بڕوایان بەو پۆلێن و دابەشکردنەش نیە کە لە بڕگەی پێشوودا ئاماژەمان پێکرد. هەروەها گوێ بە مەرجی دروستیی و نادروستیش نادەن، بگرە گوێ بەوەش نادەن کە هیچ فەرموودەیەك لەگەڵ قورئان بەراورد بکەن.

بەداخەوە ئەم ڕەوتە لە مێژووی ئیسلامیدا زۆرجار زاڵبوون و گەیشتوونەتە ئاستێك کە وتویانە: (قورئان بە سوننەت نەسخ دەبێتەوە).

٣- ڕەوتی سێیەم ڕەوتێکی دروستە، کە ئێمە دەبێ پەیڕەویی لێبکەین، ئەویش تێگەیشتنی زانایانی موحەققیقی ئوممەتی ئیسلامەو بەمجۆرەیە:

جۆری یەکەمی فەرموودە - و بەگشتی (سوننەت) - کە لە بڕگەی پێشوودا باسمان لێکرد، پاش قورئانی پیرۆز، سەرچاوەی دووەمە بۆ تێگەیشتن لە هەندێك لە درێژەی حوکمەکان، بە مەرجێك جگە لە دڵنیابوونەوە لە دروستیی و نادروستیی سەنەدی فەرموودەکە، لە ڕووی مەتن و دەقەکەشیەوە دڵنیابوونەوە دروست بوویێت و لەگەڵ قورئان دژایەتیی نەبێت.

ئەمەش بابەتێکی دوورو دێژەو قسەی زۆری ئەمپەڕو ئەوپەڕ گرتنی تێدا کراوە، ئێمە نزیکترین ڕا لە حوکمی قورئانەوە هەڵدەبژێرین و تەرجیح دەدەین، هیواداریین ئەگەر ڕایەکی تری جیاواز، بیسترا، یان بینرا، نەکرێتە کێشە، چونکە ڕاو هەڵوێست زۆرن و ئەم بەشەمان وەك ڕایەکی پەسەندی میانە وەرگرتووە، کە کورتەکەی ئەمەیە:

أ- لەدرێژەی بابەتی ئیمان و بیرو بڕواو پاشەڕۆژدا، قورئان ئایەتی زۆری تەرخان کردووەو پێویست ناکات پەنا ببرێتە بەر فەرموودەی جۆری (ئاحاد)، هەرچەند پلەشیان (صەحیح) بێت.

ب - پوختەی (ئەحکام) و (ئەخلاق)و بنەماکانیان، لە قورئاندا باسکراون و دەکرێ بۆ زیادە ڕوونکردنەوە سوود لە فەرموودەی دروست وەربگیرێت.

ج - زۆربەی زانایانی حەنەفی و شافعی و تەواوی مالکییەکان - جگە لە هەندێك لە حەنبەلی و زاهیرییەکان - جەختیان کردۆتەوە لەسەر ئەوە کە فەرموودەی (ئاحاد) زانیاریی و عیلمی یەقین ناگەیەنن و گومان دەگەیەنن، بۆیە پێویست ناکات بکرێنە سەرچاوەی بابەتی گرنگی بیروباوەڕو ئەحکام.[١]

د- لە وەرگرتنی هەر فەرموودەیەکدا هەوڵبدەین ئەصڵێکی لە قورئانی پیرۆزدا بدۆزینەوە بۆ پشتڕاستکردنەوە.

---

(١) لەو زانایانەی ئەم زانیارییەیان پشتڕاست کردۆتەوە: نەوەوی لە شەرحی لەسەر (صحيح مسلم)، ١٣١/١. سەرەخسی لە (المبسوط)، ١٦١/٤. ابن حزم، لە (الإحكام في أصول الأحكام)، ١٠٧/١. (ابن عبد البر) لە (التمهيد)، ٨/١. شەوکانی لە (إرشاد الفحول)، ص: ٣٨.

# دەربارەی مامەڵە و هەڵس وکەوتی پێغەمبەری خوا

لە ژێر ناونیشانی (تصرفات النبي)دا، ژمارەیەك لە زانایانی موحەققیق مامەڵەو هەڵسوکەوتی پێغەمبەری خوایان باس کردووەو پۆلێنیان کردوون بۆ چەند جۆرێك، کە ئەمەی خوارەوە پوختەو کورتەی ئەو باسەیە:

١- هەڵس و کەوتە تەشریعییەکانی:

بەشێك لە وتەو مامەڵەو هەڵس وکەوتەکانی پێغەمبەری خوا تەشریعیی بوون، واتە: وەك پێغەمبەرو گەیەنەری حوکمی خواوەند (مبلغ) دەری خستوون. کە ئەوانە بە ڕەچاوکردنی ڕێسا گشتییەکانی (عام)و (خاص)و (مطلق) و (مقید) و (مجمل) و (مقید)، واجبە پەیڕەوییان لێ بکرێت. ئەم بەشە هەندێك لە زانایان - وەك شهاب الدين القرافي (ت: ٦٨٤ ك)- ناویان لێناوە: (تصرفات بالرسالة).[1]

---

(١) بڕوانە کتێبی: الإحكام في تمييز الفتاوى عن الأحكام وتصرفات القاضي والإمام، شهاب الدين القرافي، ص: ٢٣.

٢- هەڵس و کەوتەکانی وەك موفتی:

ئەو بەشەن لە هەڵس و کەوتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کە مەبەست لێیان فتوادان بووە لەسەر حاڵەتانێکی تایبەت بەو سەردەمە، هەندێك جار ڕوونکردنەوەی موجمەلێکی قورئان بووە.

٣- هەڵس و کەوتەکانی وەك حاکم و قازییەك:

ئەم جۆرە هەڵس و کەوتەش لە لایەن پێغەمبەرەوە هەبووە. واتە: هەندێك بڕیارو حوکم و هەڵس و کەوتی هەبووە کە قەزاوەتی نێوان دوو کەس یان چەند کەس بووە، کە یان خۆی پێی زانیوە، یان خاوەنەکانیان کێشەکەیان بە مەبەستی یەکلاکردنەوە بردۆتە لای.

٤- هەڵس و کەوتەکانی وەك سەرکردەو پێشەوایەك:

ئەم جۆرە هەڵس و کەوتەش لە لایەن پێغەمبەری خواوە هەبووە. واتە: هەندێك بڕیارو هەڵس و کەوتی هەبووە وەك سەرکردەو پێشەوای ئەوکاتەی موسڵمانان دەری کردوون.

(قەررافی) دەڵێت: "ئەو کارانەی پەیوەندییان بە قەزاو پێشەواییەوە هەیە، نابێت کەس پێیان هەستێت مەگەر بە مۆڵەتی تایبەتی لە لایەن قازی، یان پێشەوای سەردەمەوە."[1] مەبەستی ئەوەیە مەرج نیە حاڵەتەکان و هەموو لایەنەکانی دۆسیە فتوایی و قەزاییەکان و

---

(١) الإحكام في تمييز الفتاوى عن الأحكام وتصرفات القاضي والإمام، شهاب الدين القرافي، ص: ٢٦.

جۆری کەسەکان لەیەك بچن و وەکو یەك وا بن، تا قازی و موفتی و سەرکردەی ئەم سەردەمە، کت و مت هەمان حوکم جێبەجێ بکات، کە لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) کراوە بە پاساوو بەڵگەی ئەوەی، کە پێغەمبەری خوا ئەنجامی داوە، بۆیە دەبێت موفتی و حاکم و پێشەوای شەرعیی سەردەم، ئەو حوکمە بدەن و یەکلای بکەنەوە!

نمونەی ئەم هەڵوێستانەی پێغەمبەری خوا، خۆی هەندێك جار ڕوونی کردوونەتەوە، بۆ نمونە فەرموویەتی:

(إنكم تختصمون لديّ، وإنما أنا بشر، فلعل بعضكم أن يكون ألحن من بعض، فأقضي له على نحو ما أسمع. فمن قضيت له من حق أخيه شيئا، فلا يأخذه، فإنما أقطع له قطعة من النار)[1].

واتە: ئێوە زۆر جار ناکۆکییەکانتان دێننە لای من، منیش مرۆڤێکم، ئێوەش لەوانەیە هەندێکتان لە هەندێکی ترتان دەم پاراوترو قسەڕەوانتر بێت، منیش لەوانەیە بەوجۆرە، کە گوێم لێدەبێت، قەزاوەت بکەم. جا، هەرکەس قەزاوەتم بۆ کردو لە مافی براکەی کەوتە سەری، با پێی ڕازی نەبێت و وەری نەگرێت، چونکە ئەوە پارچەیەك لە ئاگرم بۆ دابڕیوە.

ئەم فەرموودەیە زۆر بەڕوونی دەری دەخات، کە هەندێك جار پێغەمبەری خوا بە ئیجتیهادو بۆچوونی خۆی قەزاوەتی کردووە، دوور لە وەحی و ڕێنمویی خوایی.

---

(١) بوخاری بە ژمارە (١٦٢/٣) و موسلیم بە ژمارە (١٢٩/٥) گێڕاویانەتەوە.

لە کۆتایی ئەم دابەشکردن و پۆلێنکردنەدا بۆ هەڵس و کەوتی پێغەمبەری خوا، گرنگە بزانین کە ئەم بابەتە لە بنەما شەرعییە سەرەکیی و گرنگەکانە، بۆیە (قەررافی) لەکۆتایی باسەکەیدا وتوویەتی: " لەسەر ئەم یاسایەو ئەم جیاوازییانە، هەڵس و کەوت و (تصرفات)ی پێغەمبەرت بۆ دەردەکەوێت، (صلی الله علیه وسلم)، جا، تێبگە کە ئەم باسە لە بنەما شەرعییەکانە."[١]

---

(١) الفروق، شهاب الدین القرافی، ١/١٠٩.

# ٤

# چ جۆرێکی (سوننەت) بە بەڵگە وەردەگیرێت؟

دیارە لە (فەرموودە)دا - واتە ئەو بەشەی کە گوفتاری پێغەمبەری خوایە- لە جۆری یەکەمی بڕگەی (یەکەم)دا، چوار مەرج گرنگن:

أ- دەبێ پێوەری زانایانی متمانەپێکراوی فەرمووەدەناس (صحیح) یان (حسن) بێت و نەچێتە خانەی (موضوع) و (ضعیف)، واتە مەرجەکانی هەردوو لایەنی (مەتن و) (سەنەد)ی تێدا بێنەجێ.

ب- دەبێ دەقی فەرموودەکە دژایەتی لەگەڵ واتاو مەدلولی ئایەتێکی (قطعي الدلالة)[1]ی قورئان نەبێت.

---

(١) دەقەکانی (قورئان و سوننەت) لە ڕووی هێزی بەبەڵگەکردنیانەوە، بە گشتیی دەبنە چوار جۆر: ١- قطعي الثبوت والدلالة. ٢- ظني الثبوت والدلالة. ٣- قطعي الثبوت، ظني الدلالة. ٤- ظني الثبوت، قطعي الدلالة. دیارە قورئانی پیرۆز هەمووی (قطعي الثبوت)ە، چونکە گومان لە (وەحی) ناکرێ، بەڵام زۆرێك لە ئایەتەکان (ظني الدلالة)ن، چونکە زیاتر لە ماناو مەدلولێك هەڵدەگرن. فەرمودەش زۆربەیان لە جۆری دووەمن، چونکە لە ڕووی سەلماندنەوە جۆری (هەڵبەستراو)و (لاواز) زیاترن و لە ڕووی واتابەخشینیشەوە زۆریان زیاتر لە

ج- دەبێ دژایەتی لەگەڵ ڕێسای گشتی (قواعد) و (ظوابط)ی هەڵێنجراو لە قورئان نەبێت.[(١)]

د- دەبێ بە قەرینەو نیشانەی سیاقدا دەرکەوێت، کە ئەو فەرموودەیە وەك (پێغەمبەرێکی ڕەسوڵ) فەرموویەتی، نەك بە ئیعتباری تری قەزاوەتی تایبەت، یان عادەتی شەخصی، وەك پێشتر جیامان کردنەوە. (ئەمە مەرجێکی هەستیارەو ڕەچاونەکردنی ئەم خاڵەیە، کە خەڵکێکی زۆری بە هەڵەدا بردووەو بە تاکە فەرموودەیەك فتوای ناڕەوا دەردەکەن).

لە (سوننەت) و (سیرەت)یشدا هەمان ئەو مەرجانە، کە ئاماژەمان پێکردن دووبارە دەبنەوە.

هـ - دەبێ ئەگەر فەرموودەکە لە جۆری تەشریعیش بوو، بەڵگە هەبێت کە ئەوکارەی دەیکات تایبەت بەخۆی نیەو بۆ هەموو ئوممەتی ئیسلامە، بۆ نمونە: واجب بونی شەو هەستانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە سەرەتای بانگەوازدا - کە سەرەتاو کۆتایی سورەتی

---

مانایەك هەڵدەگرن. (بۆ زیاتر ئاشنا بوون بەم بابەتە کە زیاتر لە سەرچاوەکانی زانستی (أصول الفقه)دا باس کراوە، بڕوانە ئەم سەرچاوانە: (الموافقات)ی (شاطبي)، (الوجیز في أصول الفقه)ی (د.عبد الکریم زیدان)، (أصول الفقه)ی (محمد أبو زهره)، (أصول الفقه في نسیجة الجدید، د. مصطفی الزلمي).

(١) بابەتی (قەواعدی قورئانیی)، یان (فیقهیی)، یان (أصولی)، بابەتێکی گرنگە، لە کۆن و نوێدا لەسەری نووسراوە، پێشتر زانایان دەستەواژەی (قواعد فقهیه)یان← →بۆ بەکارهێناوە. نمونەی هەندێك کتێبی هاوچەرخ لەو بوارەدا: (قواعد قرآنیة في النفس والحیاة، د. عمر عبد الله المقبل). (معجم القواعد القرآنیة، د. محمد موسی الشریف)، (القواعد الأصولیه)، د. مصطفی زەڵمی.

(المزمل) باسی دەکات - یان هێنانی زیاتر لە چوار هاوسەر. کە ئەمانە بەڵگەی ڕوون هەن، حوکمی تایبەتن بەخۆی.[(١)]

---

(١) بۆ بابەتی سوننەتی کرداریی، گەڕانەوە بۆ ئەم سەرچاوانە گرنگ و بەسوودە: ١- الإحكام في أصول الأحكام، أبو الحسن، علي بن أبي علي بن محمد بن سالم الأمدی (ت: ٦٣١ك). ٢- تنقيح الفصول، أحمد بن إدريس القرافي، (ت: ٦٨٤ ك). ٣- قواعد الأحكام في مصالح الأنام، سلطان العلماء، عز بن عبد السلام، (ت: ٦٦٠ ك).

# چـۆنیـەتـی کارکردن بە سوننەت

بۆ ئەوەی حوکمی کارکردن بە سوننەت - بە هەموو جۆرەکانییەوە - بەواجب دابنرێت، ڕەچاوی ئەم خاڵانە پێویستن:

١- سەرەتا دڵنیابوونەوە لەو خاڵانەی سەرەوە.

٢- پاشان، ئاگاداربوون لە بنەما سەرەکییەکانی زانستی و فەرموودە (علوم الحديث)، بەتایبەتی لەجیاکردنەوەی (صحيح) لە (ضعيف) و (آحاد) لە (متواتر) و..هتد.

٣- نابێت فتوا بە تاکە فەرموودەیەك بدرێت، بەڵکو دەبێ بۆ دەرهێنانی حوکمێك، کۆی ئەو فەرموودانە کۆبکرێنەوە، کە پەیوەندیدارن بە بابەتێکەوە، پاشان لەکۆی هەموویان تێگەیشتنی دروست پەیدا دەبێ.

٤- نابێ پەنا ببرێتە بەر تەئویل و چەماندنەوەی نازانستیی واتا و مەدلولی فەرموودە، واتە: بەپێی ڕێساکانی زمانی عەرەبی واتا بکرێت.

٥- دەبێ گرنگیی بە تێگەیشتنی (مەقاصیدیی) بدرێت، واتە دوورکەوتنەوە لە ماناکردنی (حەرفی) و (ظاهری) و فەرامۆشکردنی لایەنی حیکمەتی حوکمەکان، کە لە فەرمودە دەردەهێنرێن.

٦- ئاشنایی بەرێسا گشتییەکانی زانستی (أصول الفقه)، بەتایبەتی باسەکانی (مطلق) و (مقید) و (عام) و (خاص) و (مجمل) و (مفصل) و. هتد، چونکە بەبێ ئاشنایی بەو باسانە، تێگەیشتن لە فەرموودە زەحمەتە.

٧- بۆیە وا باشترە کەسانێك، کە (فەقیهـ) نین و بەو زانستانە ئاشنا نین، خۆیان لەو جۆرە فەرمودانە نەدەن کە حوکمیان تێدایەو، زیاتر بایەخ بەو فەرمودانە بدەن، کە پەیوەندییان بە ئامۆژگاریی و ڕێنمویی و (وعظ) و (ئیرشاد)ەوە هەیە.

# سەرچاوە بنەڕەتییەکانی فەرموودە

**لە سەرچاوە مێژووییە بنەڕەتییەکاندا، چەندین جۆر سەرچاوە بۆ فەرموودە هەن، جیاکردنەوەو تێگەیشتنی پێگەیان، پێویستە، لەوانە:**

١- کتێبەکانی (الصحاح):

کە دوو صەحیحی بوخاری و صەحیحی موسلیم مەشهورترینیانە، کە خاوەنەکانیان بە مەرجیان گرتووە دەبێ ئەو ڕیوایەتەی دایدەنێن (صەحیح) بێت، ئەڵبەتە هەرکامیان بۆ خۆیان بۆ دروستیی فەرموودە، مەرج و مەنهەجییەتی خۆیان هەیە.

٢- کتێبەکانی (السنن):

ئەوانەن، کە کراونەتە چەند باسێك، لەسەر بنەمای بابەتە فیقهییەکان، وەك: (کتاب الطهارة)، (کتاب الصلاة)، (کتاب الزکاة). وە هەروەها، وەکو کتێبەکانی: (سنن الترمذي) و (سنن النسائي) و (سنن أبي داود). ئەمانە بە مەرجیان نەگرتووە، کە هەموو ڕیوایەتەکانیان

(صحیح) یان (حسن)بن، واتە: لاوازیشیان تێدایە، کە لە کۆتایی هەر ڕیوایەتێکدا بە وشەی (ضعیف) ئاماژەیان پێکردووە.

٣- (المسانید):

ئەو کتێبانەن کە سەنەدیان تێدایە تا سەر صەحابە ڕاوییەکان، بەشێوەی (باب) و (قسم) و (مسانید) هاتوون، وەك موسنەدی ئەحمەد کە نزیکەی (٣٠٠٠٠) سی هەزار ڕیوایەتی تێدایە.

٤- (المعاجم)یش هەن:

وەك (المعجم الکبیر)ی تەبەرانی (ت: ٣٦٠ ك)، کە ڕیوایەتەکانی بەپێی تەرتیبی صەحابە کۆکراونەتەوە و مەرجی (صحیح) بوونیان لەگەڵ نیە.

٥- پاش ئەوانە، (المصنفات)یش هەن:

کە بەشێوەی بابەتن، وەك: (مصنف عبد الرزاق) و (مصنف ابن أبي شیبە)، کە لە نێوان سالآنی (١٥٠) بۆ (٢٥٠)ی کۆچی دانراون.

## ٢ پۆلێنی فەرموودە لای زانایان

١- لە ڕووی هێزو پێگەو پلەوە، کۆی زانایانی فەرموودەناس و زانا (اصولی )یەکان، فەرموودە دەکەنە دووبەشی سەرەکییەوە:

أ- (موتەواتەر): کە ئەویش دوو جۆرە: (موتەواتەری قەولی ) و (موتەواتەری مەعنەوی )، کە ئەم جۆرە لای کۆی زانایان سەلمێنراوە و حوکمی پێ دەکرێت (ئەمجۆرە ئەو جۆرە فەرمودانە دەگرێتەوە، کە کەسانێکی زۆر دەیانگێڕنەوە، کە لە ڕووی عەقڵییەوە کۆبوونەوەیان لەسەر درۆکردن ئەستەمە ).

ب- جۆری (آحاد): ئەو جۆرەن، کە کەسێك، یان دوو کەس، یان زیاتر، دەیانگێڕنەوە، بەڵام ناگەنە ئاستی (موتەواتەر)، ئەمانەش- لای کۆی زانایان - سێ جۆرن: (مەشهور، عەزیز، غەریب).

لای زۆربەی زانایان، ئەم جۆرە بە هەر سێ بەشەکەیەوە دڵنیایی و زانستی یەقین ناگەیەنن، بۆیە باشتر وایە بەراورد بکرێن لەگەڵ قورئان، یان فەرمودەی (موتەواتەر).

لێرەدا پێویستە ئاماژە بکەین، کە (حەنەفییەکان) بە جۆرێکی تر پۆلێنی فەرموودەیان کردووە، ئەوان دەڵێن: سێ جۆرن:

١- موتەواتەر.

٢- مەشهور.

٣- ئاحاد.

واتە: (مەشهور)یان جیاکردۆتەوەو، پێیان وایە جۆرێکە لە نێوان (موتەواتەر) و (ئاحاد)دا، کە ئەو فەرموودانەن لە سەدەی یەکەمدا (ئاحاد)ن، بەڵام دواتر لە سەدەی دووەم و دواتردا، ناوبانگ و شۆرەت پەیدا دەکەن و خەڵکێکی زۆر دەیانگێڕنەوە، بۆیە بۆ حوکمەکەشیان دەڵێن: عیلمی یەقینی ناگەیەنن، بەڵام گومانی نزیك لە یەقین دەگەیەنن.

دیارە ئەم بابەتی بەش و جۆرانەی فەرمودە، زۆر لەمە زیاتر هەڵدەگرێ، ئەمە تەنها پوختەیەك بوو، دەکرێ بۆ زیادە زانیاریی، سەیری سەرچاوەکانی زانستی (علوم الحديث) بکرێت.

# میتۆدو مەنهەجیەتی جیاوازی زانایانی فەرموودەناس

ئەوەی بەدواداچوونی بۆ کارو ڕەنجی زانایانی فەرمووده کردبێت، دەزانێت کە لە بواری کۆکردنەوەی فەرموودەو مشت ومالّی سەنەدیاندا، هەولێکی نموونەیی و مێژووییان داوە، دیارە شێوازی کارکردنیان لەسەر ئەو بابەتە، جیاواز بووەو هەموویان یەك میتۆدیان پێڕەو نەکردووە.

بۆ ئەوەی مەبەست لە میتۆدو شێوازی کۆکردنەوەی زانایان بۆ فەرموودە، تێبگەین، ئاماژە بە گرنگترین ئەو تایبەتمەندییانە دەکەم کە ناسراوترین زانای فەرموودە پێشەوا (بوخاری (ت: ٢٥٦ ك) پێی ناسراوە، کە ئەم خالّانە گرنگترینیانن:

١- لە ڕووی پلەی سەنەدو دروستیی و نادروستیی ڕیوایەتەوە: تەنها (صەحیح)ی داناوەو بە پێودانگی خۆی پلەی لەوە خوارتری دانەناوە، بۆیە کتێبەکەشی ناوناوە: (الجامع المسند الصحیح)، ئەمە لە کاتێکدایە کە (نەسائی) و (ترمذی) و (ئیبن ماجە) لە (سونەن)ە کانیاندا وایان نەکردووەو ڕیوایەتی لاوازیشیان هێناوە، بەڵام لە کۆتایی ڕیوایەتەکەدا

نووسیویانە (ضعیف)، وەك ئاماژەیەك بۆ ئەوەی بزانرێت کە سەنەدو هێزی ڕیوایەتەکە لاوازیی تێدایە.

٢- پۆلێنکردنی فەرموودەکان لەسەر بنەمای (بەش و بابەتی فیقهیی)، بۆیە بوخاری کتێبەکەی کردووە بە (٩٧)بەش و هەر بەشەشی کردووە بە چەند بابەتێکی تایبەتەوە.

٣- دووبارەکردنەوەی فەرموودە: بۆیە کۆی فەرموودە کۆکراوەکانی صەحیحی بوخاری (٧٥٦٣) فەرموودەن[1]، لە کاتێکدا بەبێ دووبارە تەنها (٢٧٦١) فەرموودەن.

٤- ئەسڵ لە کاری بوخاریدا ئەوەیە کە تەنها فەرموودەی پەیوەست و (متصل)[2]ی داناوە، بەڵام جاروبار بۆ مەبەستی تایبەت و لاوەکیی، هەندێك ڕیوایەتی (مرسل)[3]و (معلق)[4]یشی داناوە.

---

(١) بە پێی ئەژماری عەللامە د. محمد فوئاد عبد الباقی.

(٢) (المتصل) بەو جۆرە ڕیوایەتە دەڵێن کە هیچ پچڕانێك لە سەرەتای زنجیرەی سەنەدەکەیەوە نیە، تا دەگەڕێتەوە سەر یەکەم ڕاوی صەحابە، واتە هەر ڕاوییەك ڕاستەوخۆ لەکەسی پێش خۆی بیستووە. (بڕوانە کتێبی: علوم الحدیث، ابن صلاح الشهرزوری، ص: ٤٤).

(٣) (المرسل) بەو جۆرە ڕیوایەتە دەڵێن کە (تابعی) یەکسەر ڕیوایەتەکە دەباتەوە سەر پێغەمبەری خواو نایباتەوە سەر ئەو صەحابییەی کە لە پێغەمبەری بیستووە. (بڕوانە: الکفایة، الخطیب البغدادي، ص: ٢١).

(٤) (المعلق)یش ئەو جۆرەیە کە لە سەرەتای سەنەدەکەیەوە ڕاوییەك یان زیاتر بەدوای یەکدا ناویان نەبرابێت. (بڕوانە: نزهة النظر، ابن حجرالعسقلانی، ص: ١٠٨).

٥- تایبەتمەندییەکی تری صەحیحی بوخاری ئەوەیە، کە لە ڕیوایاتدا جۆری (موقوفات)یشی هێناوە، واتە فتواو بۆچوونی صەحابەو تابعین، کە لە خۆیانەوەیەو، نەگەیشتوونەتەوە سەر پێغەمبەری خوا.

ئەمە لە کاتێکدایە، کە هەندێکی تر لە (محدثین) لە زۆربەی ئەو خاڵانەدا چاویان لەو کردووە، بەڵام لە زۆر خاڵیشدا پەیڕەوییان لێنەکردووە. بە وردبوونەوە لە جیاوازیی مەنهەجی بوخاری لەگەڵ کەسێکی وەك ئەحمەدی کوڕی حەنبەل، ئەو جیاوازییە دەردەکەوێت. بۆیە هەندێك لە زانایان باسی ئەو تایبەتمەندییانەیان بە دوورو درێژیی نووسیوە.[١]

لەم زەمینەیەدا ڕاستییەکی زانستیی هەیە، کە زۆرجار لەبیر دەکرێ و زۆریش گرنگە بۆ چۆنیەتی مامەڵە لەگەڵ فەرموودە، ئەویش ئەوەیە:

کاتێك دەگوترێ: فلان فەرموودە (صەحیح)ە، ئەبێ بزانین بە پێوەرو بۆچوونی کام لە زانایانی فەرموودە صەحیح و دروستە؟ چونکە هەرچەند لە هەندێك خاڵدا یەك قسە بن، بەڵام بۆچوون و مەرج و پێودانگ و فلتەرەکانیان جیاواز بوون و سەرجەمی زانایان لەسەر جۆری مەرجەکانی (تصحیح)و (تضعیف) پێوەرو ترازوویەکی یەکگرتوویان نیە..

---

(١) بۆ نمونە ابن حجر العسقلانی (ت: ٨٥٢ ك) لە (نزهة النظر في توضيح نخبة الفكر في مصطلح أهل الأثر)، یان: (شمس الدين الذهبي (ت: ٧٤٨ ك) لە (ميزان الاعتدال في نقد الرجال) و (سير أعلام النبلاء)، هەروەها: أبو زرعة، لە (الضعفاء).

بۆ نمونە:

ئەو ڕیوایەتانەی لای پێشەوا (موسلیم) بە صەحیح ناسێنراون، هەر ئەوانەن کە زۆرێکیان پێشەوا بوخاری پێشتر بە صەحیحی نەزانیون، بۆیە نەیخستوونەتە کتێبی (الجامع الصحیح)ی خۆی، بۆیە ئەوانەی لای هەردووکیان (صحیح)ن، تەنها (١٩٠٦) فەرموودەن، لە کاتێکدا بوخاری نزیکەی (٣٠٠٠)ی بە (صەحیح) زانیوە، بەڵام (موسلیم) هەموویانی وەرنەگرتووە.

یان ئەو فەرمودانەی (نسائی) و (إبن ماجە) و (ترمذی) کۆیان کردوونەتەوە، زۆربەیان هەر ئەوانەن، کە لە فلتەرەکانی (بوخاری) و (موسلیم)دا کەوتوون و نەیانخستوونەتە (صحاح)ی خۆیان، بەڵام ئەوان بە (صەحیح)یان داناون و لە (سنن)ی خۆیان کۆیان کردوونەتەوە، چونکە - وەك وتمان - مەرج و پێوەرەکانیان بۆ سەنەدی ڕیوایەتەکان جیاواز بوون. لەبەر ئەوەیشە دەگوترێت: کە بوخاری ئەو چەند هەزار فەرموودەیەی لە کۆی ٦٠٠ هەزار ڕیوایەت کۆکردۆتەوە، چونکە لەسەر سەنەدەکانیان قسەی هەبووە.

هەندێك جاریش بە پێچەوانەوە، پێشەوایانی تری فەرموودە ڕەخنەیان لە هەندێك لە ڕاوی پێشەوا (بوخاری) گرتووە، بۆ نمونە: ڕاوییەك لای (بوخاری) بە ناوی: (أحمد بن بشیر الکوفي) بەجێی متمانە زانراوە، بەڵام (نەسائی) دەڵێت:" بەهێز نیە" دارەمیش وتوویەتی: "وازی لێهێنراوە (مەتروك)ە." یان ڕاوییەکی تری لای بوخاری بەناوی

(أحمد بن المقدام بن سليمان العجلي)، (ئەبوداود) دەربارەی دەڵێت: "من فەرموودەی لێوەرناگرم، چونکە کاری بێهوودەو بێ شەرمانەی دەکرد."[١] یان کەسێك بەناوی: (إسحق بن محمد بن إسمعيل الفروي)، کە لای بوخاری جێی متمانە بووە، دارەقوتنی و حاکم دەربارەی وتوویانە: "شەرمە کە بوخاری لە کەسێکی وا فەرموودەی گێڕاوەتەوە."![٢]

ڕاستە ئەم حاڵەتانە دەگمەنن و لای سەنەدەکانی پێشەوا بوخاری دیارده نین، بەڵام هەرچۆن بێ نمونەیەکن لە قسەی زانایان، پێویستە بیانبیستین و ئاگامان لێیان بێت، بۆ تێگەیشتن لە دەستەواژەی (جیاوازیی مەنهەجیەت و پێوەرەکانی زانایانی فەرموودەو مەرجەکانیان)، چ بۆ سەنەدو زنجیرەی ڕاوی و کەسەکان، چ بۆ دەق و مەتنی فەرموودەکان، کە لە سەرەوە ئاماژەمان پێکرد، بە تایبەتی بۆ تێگەیشتنی دروست لە دوو دەستەواژەی (صحيح)و (ضعيف).

ئەی بۆچی پێشەوا حاکمی نەیساپوری (المستدرك على الصحيحين) دەنوسێ؟ چونکە پێی وایە بوخاری و موسلم زۆر دەستیان داگرتووەو زۆر فەرمودەیان نەخستۆتە ناو کتێبەکانیان، بۆیە ئەو هاتووە لە سەدەی چواری کۆچیدا بە جیا ئەو ڕیوایەتانەی هێناوە، کە لەسەر مەرجی ئەوانن، بەڵام ئەوان نەیانهێناونەتە ناوکتێبەکانیان، لەگەڵ ئەوەدا مەرجەکانی ئەوانی بۆ پلەی ڕیوایەتەکەو دروستیی و نادروستیی

---

(١) بڕوانە: الكفايه في علم الرواية، الخطيب البغدادي، ص: ٤٥٤.

(٢) الدلائل في غريب الحديث، محمد القاسم بن ثابت السرقسطى، (ت: ٣٠٢ هـ)، ص:٢١٧.

کردۆتە پێوەر..! خۆی لە پێشەکی کتێبەکەیدا (المستدرك..) دەڵێت: "لەم سەردەمەی ئێمەدا کۆمەڵێك بیدعەچی پەیدا بوون دەڵێن: هەرچی فەرموودەی دروستتان لەلا کۆبووەتەوە ناگەنە دە هەزار فەرمووده.. بۆیە ژمارەیەك لە کەسایەتییەکانی ئەهلی زانست، داوایان لێکردم، کە کتێبێك بنووسم و ڕیوایەتانێکی تێدا کۆ بکەمەوە، کە بوخاری و موسلیم پشتیان بەسەنەدەکانیان بەستووە ."(١)

بەڵام بەداخەوە وا دیارە (حاکم)یش کەوتۆتە حاڵەتی کاردانەوەی قسەی ئەو بیدعەچییانەی، کە خۆی باسیان دەکات، بۆیە بەپێچەوانەی (بوخاری و موسلیم)ەوە، لە کۆکردنەوەی فەرموودەدا دەست شل دەکات و هەزاران ڕیوایەت تۆمار دەکات، هەر ئەمەیشە وای کردووە، کە هەندێك لە زانایان ڕەخنەی لێبگرن، بۆ نمونە (ذهبي) دەربارەی ئەو کارەی (حاکم) وتویەتی: "نزیکەی نیوەی کتێبەکە لەسەر مەرجی بوخاری و موسلیمە، نزیکەی چواریەکیشی لەوانەیە، کە سەنەدی (صەحیحە)، نزیکەی چواریەکەکەی تریشی لەو کەسانەن، کە ڕیوایەتیان وەرناگیرێت و لاوازن و ناڕاستن، هەندێك ڕیوایەتیشی هەڵبەستراون." (ابن حجر)یش وتوویەتی: "حاکم دەستی شل کردووە"، (ابن تیمیة)ش وتوویەتی:" زانایانی شارەزا بە فەرموودە بە تەنها پشتیان بە (حاکم) نەبەستووە.".(٢)

---

(١) پێشەکی کتێبی: المستدرك علی الصحیحین، محمدبن عبد الله الحاکم النیشابوری.

(٢) وتاری: (المناهج الخاصة للمحدثین، منهج الإمام الحاکم)، پێگەی

ئەمانەم بۆ نمونە هێنایەوە، تا ئەگەر زانایەکمان بینی ڕەخنەی لە شێوەکارو مەنهەجی هەرکام لەو زانایانە هەبوو، نابێ پێمان سەیر بێت، یان ڕەخنەبارانی بکەین. پێشتر وتمان پێشەوا (دارەقوتنی) ڕەخنەی لە مەنهەجی بوخاری گرتووە، کەسیش ڕێی لێ نەگرتووە، یان خۆمان دەبینین کە (ابن حجر العسقلانی) - کە نازناوی (أمیر المؤمنین فی الحدیث)ی دراوەتێ - لە دەیان جێگای (فتح الباري)دا کە شەرحی بوخاری کردووە، ڕەخنە لە بوخاری دەگرێت، یان فەرمودەکانی بە لاواز دادەنێت، بە مەرجێك یەکەم سەرچاوەی متمانەپێکراوە لە ڕاڤەی فەرمودەدا، بەتایبەتی لەنێو زۆرێکی دی لە ڕاڤەکانی بوخاریدا.

---

زانستیی ئەلیکترۆنیی : articles.islamweb.net .

# کـۆتــایی

**لە کۆتایی ئەم کورتە باسەدا کە هیوادارم سوودی گەیاندبێت، بەپێویستی دەبینم کە بە کورتی ئەم تێبینییە بخەمە ڕوو:**

دەبێت ئێمە لەسەر هەمان ڕێچکەی زانایانی پێشوو بڕۆین، واتە: ڕەخنەمان لە هەر کەس و تاقم و هەر بیرکردنەوەو میتۆدو مەنهەجێك، زانستییانە بێ و، نیەتمان دڵسۆزیی بێ بۆ خزمەتی قورئان و فەرمودەو ڕاستییەکان، دوور لە تەشهیرو ناوزڕاندن و هەڵبەستن و زیادەپێوەنان، کە بەداخەوە بۆ ئامادەکردنی ئەم باسەی بەردەستی خوێنەر، حاڵەتانێکی زۆری لەم بابەتەم لەو پەیج و پێگە ئەلیکترۆنیی و کتێب و بڵاوکراوەنەدا بینی، کە تەرخان کرابوون بۆ ڕەددانەوەی باسی (ڕەوتە قورئانییەکان)و ئەو شوبهەو گومانانەی کە دەیانوروژێنن..

بۆیە بەدووری نابینم، کە زۆرجار بە هۆکاری ئەو نازانستیی بوون و بێئینصافییە، کاردانەوەی هەڵەو مکوڕبوون و سووربوون لەسەر ناهەقیی، دروست ببێ، کە ئەو کاتە بەشێك لە تاوانی بەهەڵەداچوون و مانەوە لەسەر ناهەقیی، دەکەوێتە سەرشانی لایەنی یەکەم و دەستپێشخەر.

خوای گەورە لە ناهەقیی گوتن بمانپارێزێ و ڕاستیمان پێ نیشانداو بەهرەی پەیڕەویکردنی ڕاستیشمان بداتێ.

سلێمانی

گەڕەکی کازیوەی بناری گۆیژە

شوباتی ٢٠١٦

# نــاوەڕۆك

# ڕەوتی بەناو قورئانییەکان و حوجییەتی سوننەت

سیوتی کە ساڵی (٩١١ ك/١٥٠٥ ز) وەفاتی کردوە دەڵێت:
"بزانن، بەر ڕەحمەتی خوا کەون، لەم سەردەمەی ئێمەدا، بونی شتێك تەشەنەی کردووە، کە سەردەمانێکە لەناو چووە، ئەویش ئەوەیە کەسی ڕافزی و زندیقی وا پەیدا بووە، کە دەڵێت: سوننەت و فەرمووده بەڵگەیان پێ ناهێنرێتەوەو تەنهاو بەتایبەتی قورئان بەڵگەیە.. لە ڕاستیدا پێشترو لە سەردەمی چوار پێشەواکەداو پاش ئەوانیش، زۆرێك لەم جۆرە کەسانە هەبوون، بەڵام چوار پێشەواکەو هاوەڵانیان، لە وانەو گفت و گۆو نوسراوەکانیاندا بە توندیی بەرەنگاریان بوونەتەوە.

(شاطبي)یش، کە ساڵی (٧٥٠ ك) وەفاتی کردوە، دەڵێت:
"بیرۆکەی ئیکتفا بەقورئان ڕای خەڵکانێکە هیچ سەرو بنێکیان نیە، ئەوانە لەڕێی دروست لایان داوە، واتێگەیشتون، کە قورئان درێژەی هەموو شتێکی تێدایە، بۆیە ئەحکامی سەرچاوەی سوننەیان خستۆتە لاوە، ئەوانە بەم کارەیان لەبازنەی کۆی موسڵمانان چوونەتە دەرەوەو بە جۆرێك قورئانیان تەئویل کردووە، کە هەرگیز خوا پێی ڕازی نەبووە.


COVER DESGIN

نوسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر هوتێلی شیرین پالاس
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
/TafseerOffice

2500 دینار